# كردە قسەییەكان لە دوو چامەكەی (نالی) و (سالم) دا

**هێرش چەتۆ حوسێن**

قوتابخانەی قادراوای بنەڕەتی، پەروەردەی پشدەر، بەڕێوبەرایەتی گشتی پەروەردەی سلێمانی، وەزارەتی پەروەردە، هەرێمی كوردستان، عێراق.

**ئیمەیڵ:** hersh.chato@gmail.com

## پوختە:

ئەم توێژینەوە بەناونیشانی (كردە قسەییەكان لە دوو چامەكەی نالی و سالم دا)، هەوڵێكە بۆ شیكردنەوەی ئەم دوو قەسیدەیە؛ لەڕووی پراگماتیكییەوە، بەتایبەتی لەڕووی كردە قسەییەكانەوە.

بایەخی كردە قسەییەكان لە ناسینەوەی ڕێزمانی مانای وشەكان لە گوتن و ڕستەكاندا نییە، بەڵكو بەپێی مەبەستی نێرەرە لەو دەوروبەرەی كە گوتن و ڕستەكانی تێدادەخرێنەڕوو. بۆیە زمانی شیعریش، وەک لایەنێكی بەكارهێنانی زمان بەتایبەتی شیعری كلاسیكی زمانێكی ئاسایی نییە، بۆیە توێژینەوەكە گریمانەی ئەوەی كردووە، كە كردە قسەییەكان بەشێوەیەكی بەرفراوان لە شیعردا بەرجەستە بكرێن، چونكە دەكرێت لە پشت دەربڕینی فۆرمی هەر دێڕە شیعرێک مەبەستێک لە پاڵیدا خۆی مەڵاس دابێت. سنووری توێژینەوەكە لە چوارچێوەی ئەو دوو قەسیدەیەدایە، كە سوودی لە لێكدانەوە و شرۆڤەكردنی ئەو دێڕە شیعرانە بینیوە، كە لە دیوانەكانیاندا بۆیانكراوە. هەروەها لەبەرئەوەی لە ناوەندەكانی توێژینەوە زانستییەكاندا زۆر لەسەر كردە قسەییەكان گوتراوە، بۆیە بەپێی پێویستی بابەتەكە و بەكورتی باس لە كردە قسەییەكان كراوە.

**كلیلە وشەكان:** كردە قسەییەكان، جۆری كردە، شیعری كلاسیک، قەسیدە.



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

## ٠) پێشەکی:

### ٠-١)ناونیشانی توێژینەوە:

بریتییە لە (کردە قسەییەکان لە دوو چامەکەی نالی و سالم دا)، هەوڵێکە بۆ شیکردنەوەی ئەم دوو قەسیدەیە؛ لە ڕوانگەی کردە قسەییەکانەوە.

### ٠-٢)گرنگی توێژینەوەکە:

گرنگی ئەم توێژینەوەیە دەکرێت ببێتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ ئەوانەی لێکۆڵینەوە لەو بوارەدا دەکەن، چونکە دەبێتە بەرچاوڕوونییەک بۆ چۆنییەتی دەستنیشانکردنی بوارێکی پراگماتیکی لە شیعردا. تیۆری کردە قسەییەکان تێمان دەگەیەنێت تا چەند لە شیعردا مەبەست و واتاکان پەنهان و شاراوەن.

### ٠-٣)ڕێباز و کەرەستەی توێژینەوەکە:

لەم توێژینەوەیەدا ڕێبازی پەسنیی بەکارهێنراوە، لە چوارچێوەی ئەو دوو قەسیدە بەناوبانگەی نالی و سالم دا، بۆ بەشە کارەکییەکەش پشت بە ڕێبازی (ئاماری) بەستراوە، بۆئەوەی ئەنجامی داتاکان لەڕێگەی پرۆگرامی (Excel) شیبکرێنەوە و بخرێنەڕوو؛ بۆ ئەم مەبەستەش بۆ دێڕە شیعری هەریەکەیان ژمارە دانراوە و بەجیا داتای هەر قەسیدەیەکیان دەرهاتووە.

### ٠-٤) پرسیاری توێژینەوەکە:

ئەم توێژینەوەیە هەوڵدەدات وەڵامی چەند پرسیارێک بداتەوە، وەک؛ تیۆری کردە قسەییەکان تا چەند لە شیکردنەوەی مەبەستەکانی شیعری کلاسیکیدا بەکاردێن؟ ئایا کام جۆری کردە زیاتر لەم دوو قەسیدەیەدا هەیە؟ ئایا جیاوازی جیهانبینی "نالی و سالم" لە دوو دەوروبەری جیادا بۆ یەک بابەت و بارودۆخی شاری سلێمانی چییە؟.

### ٠-٥)ناوەرۆکی توێژینەوەکە:

ئەم توێژینەوەیە جگە لە پێشەکی و ئەنجام لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەم بەناونیشانی (تیۆری کردە قسەییەکان) لەم چوار پار پێکهاتووە: کردە قسەییەکان، جۆرەکانی کردە قسەییەکان، گرنگی کردە قسەییەکان، کردە قسەییەکان و شیعری کلاسیک، بەشی دووەم بەناونیشانی(هەڵهێنجانی کردە قسەییەکان لە دوو چامەکەی نالی و



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

سالم دا) لە دوو پاری سەرەکی پێکهاتووە: لەپاری یەکەمدا شیکردنەوە و ئامار و خستنەڕووی جۆری کردە قسەییەکان لە چامەکەی نالی دا کراوە، هەرچی بەشی دووەمیشە بۆ شیکردنەوە و ئامار و خستنەڕووی جۆری کردە قسەییەکان لە چامەکەی سالم دا تەرخانکراوە، لە کۆتاییشدا لیستی سەرچاوەکان و پوختەی توێژینەوەکە بە زمانەکانی عەرەبی و ئینگلیزی خراونەتەڕوو.

## ١)تیۆری کردە قسەییەکان (Speech acts):

لەلای دێرینەکان ڕستەکان تەنیا لە چوارچێوەی ڕێزماندا لێکدانەوەیان بۆ دەکرا و جۆری ڕستەکەیان (هەواڵی، پرسیاری، داخوازی، سەرسوڕمان) دیاریدەکرد و نیشانەی خاڵبەندی تایبەتییان لە کۆتایی ڕستەکەدا دادەنا، و واتای ڕستەکەیان دوور لە دەوروبەرەکەی دیارییدەکرد، ئەمەش وای دەکرد کە زۆرجار واتای ڕستەکە ئامانجی خۆی نەپێکێت، بۆیە لە ئەنجامی ئەمەدا تیۆرێک هاتەکایەوە، بەناوی تیۆری کردە قسەییەکان. کە داهێنانی ئەم تیۆرەش دەگەڕێتەوە بۆ زانای بەریتانی جۆن ئۆستن (J.L.Austin) بەتایبەتی ساڵی ١٩٦٢ و سێرل (Searle) ١٩٧٢؛ کە بەشداری لە پەرەپێدانی ئەم تیۆرە کردووە. (حەسەن: ٢٠١٦: ٣٩). بەڵام بیری سەرەکی تیۆری کردە قسەییەکان دەگەڕێتەوە بۆ (فیجنیشتاین) کە گوتنی بە کردار لە قەڵەم دەدات. (صحراوي: ٢٠٠٥: ٢٤). واتە قسەکردن بۆ خۆی بە مانای ئەنجامدان و ڕاپەڕاندنی کارێک دێت. بۆیە تیۆری کردە قسەییەکان بە دوو بنەمای گرنگەوە بەندە؛ وەک: یەکەم؛ هەموو گوتنێک بۆ ئەنجامدانی نیاز و مەبەستی قسەکەرە، دووەم؛ وەسفی بارودۆخیش دەکرێت بە یەکێک لە ئەرکەکانی گوتن دابنرێت. (فەتاح: ٢٠١١: ٢٠٧). واتە زۆرێک لە گوتنەکان تەنها ڕستەیەکی پەسنیی ئاسایی نین، بەڵکو نیاز و مەبەستی قسەکەر لە پشت ڕستەکانەوەیە و کارێک ڕادەپەڕێنن. ((ئۆستن قسەکردنی بە ئەنجامدانی کارێک دانا، واتە جیاوازی نێوان قسەکردن و کار ئەنجامدانی هەڵوەشاندنەوە)). (تۆفیق: ١٩٩٥: ٣٨). ئەمەش پێچەوانەی ئەم گوتەیە دەبێتەوە، کە دەڵێت: قسە شەرت نییە، کردار شەرتە. چونکە ئەگەر تەماشەی هەندێک گوتن بکەین، لە ژیانی ڕۆژانەی خۆماندا، دەبینرێت، وەک؛ جیابوونەوەی ژن و مێرد و ......هتد، کە تەنها بە گوتنەکە کارەکە ئەنجام دەدرێت.

بۆیە ئەم تیۆرە لەوەدا پوخت دەکرێتەوە، کە ئەگەر لە واتای هەر گوتنێک وردبینەوە، کە قسەکەر بەکاریدەهێنێت، دەتوانین لە دوو ڕوانگەی جیاوازی واتاییەوە سەیری بکەین؛ ئەویش واتای دەرەوە و واتای شاراوە؛ کە بریتییە لە ڕاپەڕاندنی کارێک. (سەرچاوەی پێشوو: ٣٩). بۆیە ئەم تیۆرە لێکدانەوەی واتای پەیوەستکرد بە مەبەست و ئەو بارودۆخەی کە هەر گوتنێکی تێدا ئەنجامدەدرێت. (محەمەد و محەمەد: ٢٠١٥: ٥١). چونکە تیۆری کردە قسەییەکان لە ئەرک و بارودۆخی گوتنێک دەکۆڵێتەوە، کە بۆ چ مەبەستێک بەکاردێت. (عەلی: ٢٠١١: ٥٠). با سەرنج لەم دێڕە شیعرەی سالم بدەین:



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

١)" توو خوا بڵێ بە حەضرەتی "نالی": دەخیلی بم

بەم نەوعە قەد نەکا بە سولەیمانییا گوزەر!!" (دیوانی سالم: ٣٤٠).

لێرەدا ئەم گوتنەی شاعیر تەنیا گوتنێکی ڕاگەیاندن نییە، بەڵکو ئەگەر وردبینەوە لەم دێڕە شیعرە بەپێی بارودۆخی ئەوکاتەی سلێمانی؛ کە داگیرکرابوو لەلایەن عوسمانییەکانەوە، ئامۆژگارییەکی بەهێزی نالی دەکات، کە بە هیچ شێوەیەک لەم کاتەدا نەگەڕێتەوە سلێمانی. بۆیە هەر گوتنێک دەکرێت لە پاڵیدا کردەیەک لەناویدا خۆی حەشار دابێت، کە لەم دێڕە شیعرەدا کردەی ئامۆژگاریکردن هەیە. کردەکانیش جیاواز دەبن، بەپێی ئەو گوتنەی کە لەبارودۆخێکدا دەگوترێت و ئەرکی سەرەکی کردەکان ڕاپەڕاندنی کارێکە، وەک: ڕاسپاردن، هەواڵدان، هەڕەشەکردن، زانیاریی گەیاندن، پرسیارکردن، فەرماندان، بەڵێندان،......هتد. (موشیر دزەیی: ٢٠١١: ١٠٠).

## ١-١)کردە قسەییەکان:

ئەگەر تەماشەی هەموو گوتنێک یان قسەیەک بکەین، دەبینین لە بارودۆخێکدا دەگوترێت و وەسفی دۆخەکە دەکات، بەڵام ئەوەی کە گرنگە و جێی بایەخی کردە قسەییەکانە؛ ڕاپەڕاندنی هێزی کردەی قسەکردنەکەیە. بۆیە ئەوەی بەلای (ئۆستن)ەوە گرنگە ئەوەیە، کە قسەکەر لە دواندندا سێ کردە ئەنجام دەدات؛ ئەوانیش: کردەی گوتن، کردەی مەبەست، کردەی پاشکار؛ کردەی گوتن؛ خۆی لە گوتنی ڕستەیەکدا دەبینێتەوە، کە بە واتا و ئاماژەوە دیاریکراوە، کردەی مەبەست؛ خۆی لە هێنانەدی کردەکانی (بەڵێندان، پێشنیازکردن، ڕوونکردنەوە،.....هتد)، بەپێی هێزی بەیەکەوەبەستنی ئەو دەربڕینەی، کە لە ڕستەکەدا هەیە، کردەی پاشکاریش؛ خۆی لە هێنانەدی ئەنجامەکان بەهۆی دەربڕینی گوتنێک لەسەر گوێگر دەبینێتەوە، کە ئەنجامەکان ئەو جۆرە ئەنجامانەن بە بارودۆخی گوتنەکەوە تایبەت دەبن. (Levinson:١٩٩٧: ٢٣٦). ئەوەی لێرەدا ئێمە جەختی لەسەر دەکەینەوە، کردەی مەبەستە. چونکە ڕاپەڕاندنی کردەی مەبەست بەهێزی گەیاندنی گوتنەکە پێکدێنێت. (یوڵ: ٢٠١٦: ٨٥). مەبەست لە گوتنی ئەو قسەیە چییە؟ یان چ مەبەستێک لە پشت ئەم قسەکردنەدا هەیە؟. بۆیە دەکرێت هەر گوتنێک یان قسەکردنێک بۆ مەبەستی ڕاسپاردن، ڕاگەیاندن، هەڕەشەکردن، زانیاری دان، پرسیارکردن، فەرماندان، دڵنیاکردن، بەڵێندان و دەیان مەبەستی دیکە بەکاربێت، هەر ئەم مەبەستانەشە (ئۆستن) بە کردە قسەییەکان ناویان دەبات. (تۆفیق: ١٩٩٥: ٤٠). بۆیە دەکرێت گوتنێک لە شێوەی ڕووکەشەکەی هەواڵ گەیاندن بێت، بەڵام لە ناوەرۆکدا مەبەستێکی دیکەی لە پشت ئەم گوتنەوەیە بێت و مەبەستی هەواڵ گەیاندن نەبێت، بەڵکو لەوانەیە مەبەستی ئامۆژگاریکردن یان فەرماندان،......هتد بێت. بۆ نموونە؛ ئەگەر ساڵێک باران درەنگ ببارێت و لەو دۆخەدا جوتیارەکە بڵێت: ٢)" باران نەباری". مەبەستی جوتیارەکە لە پاڵ ئەم ڕستە هەواڵییەدا؛ ئەوەنییە کە پێمان بڵێت و زانیاری ئەوەمان بداتێ، کە ئەمساڵ باران نەباریوە؛ بەڵکو ناڕەزایی و بێزاری لەو دۆخە دەربڕیوە.



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

### ١-٢) جۆرەكانی كردە قسەییەكان:

بەپێی تیۆری كردە قسەییەكان هەموو قسەیەك دەبێت كردەیەكی تێدابێت، جا بە ئاشكرا بێت نائاشكرا، بۆیە لێرەدا كردە قسەییەكان دوو جۆر دابەشكردنیان هەیە:

### ١-٢-١) كردە قسەیی ئاشكرا:

لە كردە قسەیی ئاشكرادا چەند تایبەتمەندییەك هەیە، دەبێت لە گوتنەكەدا بەرجەستە بێت، وەك:

١- كردە قسەییەكە دەبێت كارێكی ڕاگەیاندنی (ڕاپەڕاندن)ی تێدابێت و لە تافی ئێستادا بێت، وەك؛ گفت دەدەم، بەڵێن دەدەم، پەیمان دەدەم،......هتد.

٢- لەو جۆرە ڕستانەدا دروستی و نادروستی نایەت، لەبەرئەوەی ڕستەكە وەسفی نییە، تەنیا نرخیان بۆ دادەنرێت؛ واتە ڕستەكە بەجێیە یان نابەجێیە.

٣- بكەری ڕستەكە دەبێت كەسی یەكەمی تاك یان كۆ بێت. (فەتاح: ٢٠١١: ٢٠٩-٢١٠).

### ١-٢-٢) كردە قسەیی نائاشكرا (شاراوە):

لە كردە قسەیی نائاشكرادا چەند تایبەتمەندییەك هەیە، كە پێچەوانەی كردە قسەیی ئاشكرایە، وەك:

١- كردە قسەیی نائاشكرا كاری ڕاپەڕاندنی تێدانییە و مەرج نییە لە تافی ئێستادا بێت.

٢- لەو جۆرە ڕستانەدا، دەبێت بەجێ یان نابەجێ بێ، دروست یان نادروست بێ، هەروەها مەرجیش نییە بكەرەكەی كەسی یەكەمی تاك و كۆ بێت. (سەرچاوەی پێشوو: ٢١٠).

ئەگەر لەم دوو دابەشكردنەی كردە قسەییە ئاشكرا و نائاشكرا وردبینەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی تاكە خاڵی جیاكەرەوەی نێوانیان تەنیا كارێكی ڕاگەیاندن (ڕاپەڕاندنە) لە گوتنەكەدا هەبێت، وەك: ٣) "بەڵێندەدەم دیارییەكەت بۆ دەهێنم" لێرەدا تەنها بەهۆی (بەڵێندەدەم) گوتنەكە بۆتە كردە قسەیی ئاشكرا. ئەگەر (بەڵێندەدەم) لە گوتنەكەدا لادەین و بڵێین؛ (دیارییەكەت بۆ دەهێنم) گوتنەكە دەبێت بە كردە قسەیی نائاشكرا.

### ١-٣) گرنگی كردە قسەییەكان:

كردە قسەییەكان وەك لایەنێكی پراگماتیك ڕۆڵی كارای لە گواستنەوەی زانیاری لە نێوان نێرەر و وەرگردا بەشێوەی ئاشكرا یان نائاشكرادا هەیە. پێش ئۆستن گوتن و قسەكان تەنها لە چوارچێوەی بۆتەی ڕێزمانی ناو وشە



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

بەکارهاتووەکانی ڕستەکان زانیاری لێهەڵدەهێنجرا و دوور لە بارودۆخ لێکدانەوەیان بۆ دەکرا، بەڵام کە ئۆستن هات؛ پێی گوتین چوارچێوە و بارودۆخی گوتنەکە جۆری زانیارییەکەمان پێدەدات. بۆیە لە تیۆری کردە قسەییەکان بارودۆخ بڕیار لەسەر گوتنێکی وەک: ٤) "ئەم چایە بەڕاستی ساردە! " دەدات، ئەگەر ئەم گوتنە لە وەرزی زستان دا بگوترێت، ئەوا بە واتای (گازندەکردن)دێت، بەڵام ئەگەر لە وەرزی هاوین دا ئەم گوتنە دەرببڕدرێت، ئەوا بە واتای (پەسەندکردن) دێت. (یول: ٢٠١٦: ٨٤). بۆیە بۆ لێکدانەوەی واتا و مەبەستی کردەی گوتنەکە دەبێت پشت بەو بارودۆخە ببەستین، کە گوتنەکەی تێدا ئەنجام دەدرێت، چونکە هەتا نەگەڕێینەوە بۆ چوارچێوەی بارودۆخەکە، مەبەست و واتای گوتنەکە دەرناکەوێت، بۆ نموونە؛ ئەگەر لەم گوتنەش وردبینەوە ٥) "جگەرە ناکێشی"، ئاخێوەر جگەرە کێشە و بە وەرگر دەڵێت: جگەرەیەک ناکێشی. مەبەستی ئاخێوەر زانیاری پەیداکردن نییە، داخوا وەرگر جگەرە دەکێشێ یان ناکێشێ؛ بەڵکو مەبەستی کردەی ئەم گوتنە ئەوەیە؛ من جگەرەیەک دەکێشم و فەرموو تۆش ئەو جگەرەیە بکێشە.

بەم جۆرە دەبینین کە مەبەست لە بەکارهێنانی هەر گوتنێک بە بارودۆخی قسەکەر و گوێگر و چوارچێوەی گوتنەکەوە دەبەسترێت. (هۆدسۆن: ١٩٨٧: ١٨٩). نەک تەنیا بە واتای وشەکان خۆیان و ئەو بۆتە ڕێزمانییەی کە کەرەستەکانی گرتۆتە خۆی. کەواتە لێرەدا گرنگی کردە قسەییەکان دەر دەکەوێت، کە گوتنێک لەوانەیە مەبەستی ڕاسپاردن، ڕاگەیاندن، هەڕەشەکردن، زانیاری دان، پرسیارکردن، فەرماندان، دڵنیاکردن، بەڵێندان و دەیان مەبەستی دیکە بەکاربێت. (تۆفیق: ١٩٩٥: ٤٠). بۆیە گرنگی کردە قسەییەکان پێمان دەڵێت؛ دەبێت جیاوازی لە فۆرمی دەربڕین و مەبەست لە دەربڕین یان گەیاندنی مەبەست بکەین. (Baker and Hengeveld:١١٧:٢٠١٢).

## ٤-١) کردە قسەییەکان و شیعری کلاسیک:

ئەگەر تەماشەی شیعر بکەین، دەبینین زمانی شیعری کلاسیک لە زمانی ئاخاوتنی ئاسایی خەڵک زۆر جیاوازە. چونکە لە شیعری کلاسیکدا شاعیران هەوڵدەدەن، کە زۆرترین مەبەست و مانا بە کەمترین وشە دەربڕن. (سەید حسێنی: ٢٠٠٦: ٣٤). زمانی شیعری کلاسیک پڕە لە هونەرەکانی ڕەوانبێژی و مەبەستی شاراوە. ئەمەش لە ئەنجامی ئەوەوە دێت، کە شیعر بەرهەمی بیر و خەیاڵی خودی تاکە کەسە و پەیوەندی بە مەبەستی شاعیرەوە هەیە و ئەو واتایەی شاعیر مەبەستییەتی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەربڕاوە. (موشیر و ئەحمەد: ٢٠١٢: ٩١٢-٩١٣). خوێندنەوە و پەیپێبردنی کردەی مەبەستی شیعر کارێکی ئاسان نییە، و لێکدانەوە و ڕاڤەکردنێکی وردی دەوێت، هەتا دەتوانرێت بە مەبەست و واتای شیعرەکە بگەیت. چونکە لە پانتایی ئەدەبدا و شیعر وەک ڕەگەزێکی سەرەکی؛ بونیاتی شاراوەی واتا دیاردەیەکی پڕ لە ڕایەڵی زمانییە. (ئەحمەد:٢٠٠٩: ٣١). لێرەدا ئەگەر وردبینەوە، دەبینین زمان دەبێتە نێوک بۆ شیعر و لەو ڕێگەیەوە، شاعیر هەوڵدەدات، جیهانێکی پڕ لە جوانی بنیات بنێت، و



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

لەڕێگەی باخچەی وشەکانی ڕازاوەتری بکات، و لە ناخی زمانەوە بابەتێکی دیکە مسۆگەر بکات. هەر بۆیەشە ڕەخنەگرانی شیعر لە دوو ڕووەوە تەماشەی پێکهاتەی شیعر دەکەن، ئەویش مەبەست و شێوازی دەربڕینە، بەڵام لەمیانەی ئەو دابەشکردنەشەوە پرسیار لە بەهای هەر یەک لە مەبەستی شاعیر و چۆنییەتی گەیاندنی مەبەستەکەی دەکەن. (عەبدولواحید و فەتاح: ٢٠٠٨: ٧). هەر بۆیە لە ڕێگەی پراگماتیکەوە دەتوانرێت، بەدوای ئەو واتا و کردە مەبەستە شاراوانەی شاعیردا بگەڕێیت، کە لە چوارچێوەی بەکارهێنانی زمانی شیعرەکانییەوە خۆی حەشارداوە. هەر لەبەرئەوەشە تیۆری کردە قسەییەکان دەتوانرێت ببێتە ئامرازێکی زمانەوان و لێکۆڵەرەوان، تا لەو ڕێگەیەوە بتوانن، کە ئەو گوتنانەی هێزێکی ڕەوانبێژییان تێدایە، وەک بەشێک لە واتاکانیان بۆ جێبەجێکردنی کردە قسەیی دیکە بەکاربێن، کردەی مەبەستی شیعرەکە بدۆزێتەوە. (تۆفیق: ١٩٩٥: ٦٣).

ئەگەر تەماشای دوو چامەکەی "نالی و سالم" بکەین، دەبینین لە سەردەم و بارودۆخێکی دیاریکراودا گوتراون؛ کە دەبێت خوێنەر و شرۆڤەکەر پاشخانێکی باشی بۆ ئەو وشە و دەستەواژانە هەبێت، کە پەیوەستن بەو دەوروبەرەوە، وەک: (داری پیرمەسوور، شێخ هەباس، خاکوخۆڵ، شیوی ئاودار،......هتد). لێرەدا شاعیر بێجگە لە زمان هیچی دیکە شک نابات، نامەی شیعری خۆی پێدا بنێرێت، بۆیە ناچارە زمان بکاتە پردێک لە نێوان خۆی و وەرگردا. (حەسەن:٢٠٠٤: ١٢). بۆیە کردە قسەییەکان دەبێتە هۆی پیشاندانی هەست و ناخی شاراوەی هەر دوو شاعیر و خوێندنەوەیان بۆ بارودۆخی ئەوکاتە.

## ٢) هەڵهێنجانی کردە قسەییەکان لە دوو چامەکەی نالی و سالم دا:

دەکرێت کردە قسەییەکان وەک پێوانێکی ورد لە دیاریکردن و دەرهێنانی کردەی مەبەست لە گوتنی شیعردا بەکاربێت و لایەنی شاراوەی گوتنی شیعرەکان دەربخات. لەم دوو چامەی "نالی" و "سالم"دا کە بۆ یەکترییان ناردووە، سەر بە شیعری ڕێبازی کلاسیکی کوردین و بەهۆی کردە قسەییەکانەوە هەوڵدەدرێت واتای پشت فۆرمی گوتنی وشەکانیان هەڵبهێنجرێت و پاشان بخرێنەڕوو. بەمەش مەبەستەکانی هەردوو شاعیر لەم دوو چامەیەدا دەردەکەوێت.

### ٢-١) جێبەجێکردنی کردە قسەییەکان لە چامەکەی نالی دا:

چامەکەی نالی کە گوزارشت لە سەردەم و بارودۆخێکی دیاریکراوی ئەو سەردەمە دەکات؛ یەکە یەکەی دێڕە شیعرەکان لێکدانەوەیەکی پراگماتیکییان بۆ کراوە، لە چوارچێوەی جۆری کردە قسەییەکانەوە، کە دەکرێت لە یەک دێڕدا دوو جۆر کردە هەبێت، و پاشان ئامار و گفتوگۆکراون:



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

| ژ | دێڕە شیعر | جۆری کردە | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١ | قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور<br>ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور | پیاهەڵدان | شـاعیر لە دێڕەکـانی (١،٢،٣، ٤)دا بەشـێوەیەکی سـەرنجڕاکێش بە بـایەکەدا هەڵـدەدات؛ کە نـامەکەی هەڵگرتـووە، بەڵام لە نیـوەی دووەمـی دێـڕی چوارەمـدا شـاعیر گلەیـیش لە بـایەکە دەکات؛ کە لەسەر یەک شێوە جێگیرنییە. |
| ٢ | ئەی لوطفەکەت خەفییو هەوا خواه و هەمدەمە!<br>وەی سـروەکەت بەشـارەتی سـەر گۆشـەیی حوضوور! | پیاهەڵدان | |
| ٣ | ئەی هەم میزاجی ئەشکی تەڕ و گەرمی عاشقان:<br>طۆفانی دیدەوو شەرەری قەلبی وەک تەنوور! | پیاهەڵدان | |
| ٤ | گاهێ دەبیی بە ڕەوح و دەکەی باوەشێنی دڵ<br>گاهێ دەبیی بە دەم دەدەمێنی دەمی غوروور | پیاهەڵدان<br>گلەییکردن | |
| ٥ | مەحوی قەبووڵی خاطری عاطر شەمیمتە<br>گەردی شـیمال و گێـژی جەنـووب و کـزەی دەبوور | پاکانەکردن | |
| ٦ | سووتا ڕەواقی خانەیی صەبرم، دڵ و دەروون<br>نەیماوە غەیری گۆشەیی ذیکرێکی یا صەبوور | نارەزایی دەربڕین | شـاعیر لێـرەدا نـاڕەزایی لە چاوەڕێکردن، دەردەبڕێت. |
| ٧ | هەم هەمعەنانی ئاهم و، هەم هەمڕیکابی ئەشک<br>ڕەحمـێ بەم ئـاه و ئەشـکە بـکە، هەسـتە بـێ قوصوور | پاڕانەوە | شـاعیر لەڕێـگەی گـوتەیەکی داخـوازییەوە لە بـایەکە، دەپاڕێتەوە. |



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٨ | وەک ئاهەکەم دەوان بە هەتا خاکی کۆیی یار<br>وەک ئەشکەکەم ڕەوان بە هەتا ئاوی (شیوەسوور) | پێشنیازکردن | شاعیر لە دێڕەکانی (٨، ٩،١٠)دا پێشنیاز بۆ بایەکە دەکات، کە سەرێک لە ئاوی شیوەسوور و سەرچنار بدات، بەڵام لە نیوەی دووەمی دێڕی ١٠یەمدا شاعیر زانیاری بە بایەکە لەسەر چۆنییەتی ئاوەکەی سەرچنار دەدات. |
| ٩ | بەو ئاوە خۆت بشۆ لە کودووراتی سەرزەمین<br>شادبن بە وەصلی یەکدی: کە تۆی طاهیر، ئەو طەهوور | پێشنیازکردن | |
| ١٠ | ئەمجا مەوەستە تا دەگەییە عەینی (سەرچنار)<br>ئاوێکە پڕ لە نار و چنار و گوڵ و چنوور | پێشنیازکردن زانیاری بەخشین | |
| ١١ | چەشمێکە میثلی خۆر کە لە صەد جێ، بە ڕۆشنیی<br>فەورانی، نووری صافە لەسەر بەردی وەک بلوور | زانیاری بەخشین | شاعیر لە دێڕەکانی (١١، ١٢، ١٣، ١٤)دا شاعیر زانیاری بە بایەکە لەسەر چۆنیەتی ئاوی سەرچنار دەدات، کە ئاوێکی ساف و ڕوونە، کە ئەم تایبەتمەندییانە لە ئاوی بەکرەجۆدا نین. |
| ١٢ | یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەکەدا کەوا<br>ئەستێرەکانی ڕابکشێن وەک شەهابی نوور | زانیاری بەخشین | |
| ١٣ | یا چەشمەساری خاطری پڕ فەیضی عاریفە<br>یەنبووعی نوورە دابڕژێنێ لە کێوی طوور | زانیاری بەخشین | |
| ١٤ | دەموت دو چاوی خۆمە ئەگەر (بەکرەجۆ)یی ئەشک<br>نەبوایە تیژ و بێ ثەمەر و گەرم و سوێر و سوور | زانیاری بەخشین | |



**DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021**

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٥ | داخڵ نەبی بە عەنبەری سارایی (خاک و خۆڵ) هەتا نەکەی بە خاکی (سولەیمانی)یا عوبوور | ئامۆژگاری کردن | لەم دێـــڕەدا خۆشەویســـتی زیـــاتری شـــاعیر بـــۆ شـــاری ســـلێمانی لەچـــاو زێـــدی لە دایکبوونی خۆی دەردەکەوێت. |
| ١٦ | یەعنی ڕیاضی ڕەوضە کە تێدا بە چەن دەمێ موشـکین دەبیـی بە کـاکۆڵی غیلمـان و زولفـی حوور | زانیـــــــاری بەخشین | دەکرێت لە دێڕەکانی (١٦، ١٧، ١٨)دا لێکـدانەوەی ئەوەی بـۆ بکرێت، بڵێین پیاهەڵدانە، بەڵام لە دێـڕی ١٥یەمـدا کە بـایەکە ســـەرەتا دێـــتە ســـلێمانی پێویسـتی بە زانیـاری دەبێـت لەبـارەی ئەم شـارەوە؛ بـۆیە لێـــرەدا کـــردەی زانیـــاری بەخشـــین بە گونجـــاوتر دەزانین. |
| ١٧ | خاکی میزاجی عەنبەر و، داری ڕەواجی عوود بەردی خەراجـی گەوهەر و، جۆبـاری عەینـی نوور | زانیـــــــاری بەخشین | |
| ١٨ | شامی هەموو نەهارو، فوصوولی هەموو بەهار تۆزی هەموو عەبیر و، بوخاری هەموو بوخوور | زانیـــــــاری بەخشین | |
| ١٩ | شـــارێکە عەدل و گەرمە، لە جێگـــێکە خـــۆش و نەرم بۆ دەفعی چاوەزارە دەڵێن شاری شارەزوور | پیاهەڵدان | |
| ٢٠ | ئەهلێکی وای هەیە کە هەموو ئەهلی دانشن هەم ناظیمی عوقوودن و هەم ناظیری ئوموور | پیاهەڵدان | |
| ٢١ | سەیرێ بکە لە بەرد و لە داری مەحەڵلەکان دەورێ بـدە بە پرســش و تەفتـیش و خــوار و ژوور | داواکردن | |



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٢ | داخۆ دەروونی شەق نەبووە (پردی سەرشەقام)؟!<br>پیر و فوتادە تەن نەبووە (داری پیرمەسوور)؟! | دڵنیاکردنەوە | شاعیر لە دێڕەکانی (٢٢، ٢٣، ٢٤، ٢٥، ٢٨، نیوەی دووەمی دێڕی ٢٦، ٢٧)دا لەڕێگەی گوتەکانی پرسیارکردنەوە دەیەوێت لە پاشخانی خۆی دڵنیاکردنەوە بکات، بەڵام لە نیوەی یەکەمی دێڕەکانی (٢٦، ٢٧)دا شاعیر لەڕێگەی هاوەڵکرداری کاتی (ئێستەش) دەیەوێت جەختکردنەوە لە زانیارییەکانی خۆی بکاتەوە. |
| ٢٣ | ئێستەش بە بەرگ و بارە عەلەمداری (شێخ هەباس)،<br>یا بێنەواو و بەرگە گەڕاوە بە شەخسی عوور؟! | دڵنیاکردنەوە | |
| ٢٤ | ئایا بە جەمع و دائیرەیە دەوری (کانی با)،<br>یاخۆ بووە بە تەفریقەیی شۆڕش و نوشوور؟! | دڵنیاکردنەوە | |
| ٢٥ | (سەیوان) نەظیری گونبەدی کەیوانە سەبز و صاف،<br>یاخۆ بووە بە دائیرەیی ئەنجومی قوبوور؟! | دڵنیاکردنەوە | |
| ٢٦ | ئێستەش مەکانی ئاسکەیە (کانیی ئاسکان)،<br>یاخۆ بووە بە مەلعەبەیی گورگ و لوورەلوور؟! | جەختکردنەوە<br>دڵنیاکردنەوە | |
| ٢٧ | ئێستەش سوروشکی عیشقی هەیە (شیوی ئاودار)،<br>یاخۆ بووە بە صۆفییی وشکی لە حەق بە دوور؟! | جەختکردنەوە<br>دڵنیاکردنەوە | |
| ٢٨ | داخو دەروونی صافە، گوڕەی ماوە (تانجەرۆ)،<br>یاخۆ ئەسیری خاکە بە لێڵیی دەکا عوبوور؟! | دڵنیاکردنەوە | |



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٩ | سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو (خانەقا) بکە<br>ئایا ڕەبیعی ئاهووە، یا چایری ستوور؟! | پێشنیازکردن<br>دڵنیاکردنەوە | لە نیوە دێڕی دووەمی (٢٩)دا دوو کـــۆدی نهێنـــی هەیە لە( ڕەبیعـــی ئـــاهوو، چـــایری ســـتوور)، ئەمەش شـــاعیر مەبەســـتییەتی بەشـــێوەیەکی شاراوە لە زانیارییەکـــــانی خـــــۆی دڵنیـــــابێتەوە؛ لەوەی ئایـــــا خانەقاکەیـــان ئێســـتا مەلا و خوێنـــدەوار و ڕۆشـــنبیر و خواناسـی ڕاسـتی تێـدایە، یـان پڕە لە لە کەسانی نەفام و تێ نەگەیشـــتوو و لە ڕاســـتی دوور؟. هەروەهـــا دەشـــکرێت (چایری ستوور) مەبەستی پێ لە تورک بێت.<br>لە دێـڕی (٣٠)یشـدا شـاعیر کۆدێکی نهێنی بەکارهێناوە؛ کە دەکرێـت مەبەسـتی لە تـورکی داگیرکەر بێت. |
| ٣٠ | ســـەبزە لە دەوری گـــوڵ تەڕە وەک خەططـــی ڕوویی یار<br>یـا پووشـی وشـک و زوورە وەکو ڕیشـی (کـاکە سوور)؟ | دڵنیاکردنەوە | |



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣١ | قەلبی مونەووەرە لە حەبیبانی نازەنین،<br>یا وەک سەقەر پڕە لە ڕەقیبانی لەندەهوور؟ | دڵنیاکردنەوە | |
| ٣٢ | دەس‌بەندیانە دێن و دەچن سەر و نارەوەن،<br>یا حەڵقایانە صۆفییی ملخوار و مەندەبوور؟ | دڵنیاکردنەوە | |
| ٣٣ | مەیلێ بکە لە سەبزە درەختانی مەدرەسە:<br>ئەوراقیان موقەددیمەیی شینە یا نە سوور؟ | پێشنیازکردن<br>دڵنیاکردنەوە | |
| ٣٤ | حەوزی پڕی کە نائیبی دیدەی منە لەوێ،<br>لێڵاوی دانەهاتووە وەک سەیلی (شیوەسوور)؟ | دڵنیاکردنەوە | |
| ٣٥ | ئێستەش کەناری حەوشەکە جێی باز و کەوشەکە،<br>یاریی تیایە، یا بووەتە مەعرەضی نوفوور؟ | جەختکردنەوە<br>دڵنیاکردنەوە | |
| ٣٦ | چاوێ بخە لە سەبزەوو سێرابی دائیرە<br>جێ جیلوە گاهی چاوەکەمە نەرمە یا نە زوور؟ | پێشنیازکردن<br>دڵنیاکردنەوە | |
| ٣٧ | توخوا فەضایی دەشتی فەقێکان ئەمێستەکەش مەحشەر میثالە یا بووەتە (چۆڵی سەلم و توور)؟ | جەختکردنەوە | |
| ٣٨ | واصیل بکە عەبیری سەلامم بە حوجرەکەم<br>چیی ماوە، چیی نەماوە، لە هەیوان و تاق و ژوور؟ | پێشنیازکردن<br>دڵنیاکردنەوە | |
| ٣٩ | ئەو غاری یارە ئیستە پڕ ئەغیارە، یا نە خۆ<br>هەر غاری یارە، یا بووەتە غاری مار و موور؟ | دڵنیاکردنەوە | |



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤٠ | زارم وەکو هیلال و نەحیفم وەکو خەیاڵ!<br>ئایا دەکەومە زار و بەدڵدا دەکەم خوطوور؟! | گومان دەربڕین<br><br>پێشبینیکردن | |
| ٤١ | لەم شـــەرحی دەردی غـــوربەتە، لەم ســـۆزی هیجرەتە<br>دڵ ڕەنگە بێ بە ئاو و بە چاوا بکا عوبوور! | | |
| ٤٢ | ئایا مەقامی ڕوخصەتە لەم بەینە بێمەوە،<br>یـا مەصـڵەحەت تەوەققـوفە تـا یەومـی نەفخـی صوور؟ | ڕاوێژکردن | |
| ٤٣ | حاڵیی بکە بە خوفیە: کە ئەی یاری سەنگ دڵ<br>((نالی)) لە شەوقی تۆیە دەنێرێ سەلامی دوور... | جەختکردنەوە | شـاعیر لەڕێـگەی (حـاڵی بـکە) دەیەوێـــت جەخـــت لەســـەر هەمـوو ئەو شـتانە بکـاتەوە کە لە نامەکەدا نووسیویەتی. |

لە دوای لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی مەبەستی کردەی قسەییەکان لەم چامەیەدا، لە کۆی (٤٣) دێڕە شیعردا، کە بەشـــێوەیەکی ڕێکخـــراو وەرگیـــراوە؛ (١٧) دڵنیـــاکردنەوە و (٨) زانیـــاری بەخشـــین و (٧) پێشـــنیازکردن و (٥) جەختکردنەوە و (١) گلەییکردن و ناڕەزایی دەربڕین و نرخاندن و ڕاوێژکردن و پێشبینیکردن و گومان دەربڕین و پاکانەکردن و پاڕانەوە و داواکردن بە دەستهات، ئەنجامەکەش بەشێوەی ڕێژەی سەدی، بەم شێوە هێڵکارییەی خوارەوە دەرچوو:



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

وێنەی هێڵکاری ژمارە (١)




بەپێی ئەو ڕێژەیەی، کە لە هێڵکارییەکەی چامەکەی" نالی"دا بە دەستهات، ئەوە بۆمان بەدیاردەکەوێت، (دڵنیاکردنەوە) لە کردە قسەییەکان بەرزترین ڕێژەی تۆمارکردووە، بە جۆرێک جگە لە (زانیاری بەخشین و پیاهەڵدان و جەختکردنەوە)، ئەوانی دیکە بە هەموویانەوە نیوەی (دڵنیاکردنەوە)ش پێکناهێنن.

### ٢-٢) جێبەجێکردنی کردە قسەییەکان لە چامەکەی سالم دا:

چامەکەی سالم کە گوزارشت لە سەردەم و بارودۆخێکی دیاریکراوی ئەو سەردەمە دەکات؛ یەکە یەکەی دێڕە شیعرەکان لێکدانەوەیەکی پراگماتیکییان بۆ کراوە، لە چوارچێوەی جۆری کردە قسەییەکانەوە؛ کە دەکرێت لە یەک دێڕدا دوو جۆر کردە هەبێت، و پاشان ئامار و گفتوگۆکراون:



**DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021**

| ژ | دێڕە شیعرەکان | جۆری کردە | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١ | جانم فیدایی سروەکەت ئەی بادەکەی سەحەر!<br>ئەی پەیکی موستەعید لە هەموو ڕاهی پڕ خەطەر! | پیاهەڵدان | شاعیر لە دێڕەکانی (١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩)دا، بەشـــــــــــێوەیەکی ســـەرنجڕاکێش وەســـفی بـــــایەکە دەکـــــات؛ کە نامەکەی هەڵگرتووە. |
| ٢ | ئەی میروەحەی جەمالی مەەئاسایی دڵبەران<br>وەی شانەزەن بە کاکۆڵی تورکانی سیمبەر! | پیاهەڵدان | |
| ٣ | جاڕووکەشی مەنازیلی جانان لە خەڵوەتا!<br>فەڕاشـی فەرشـی سـەبزە، بەهـاران، لە دەشـت و دەر! | پیاهەڵدان | |
| ٤ | ماڵش دەدەی بە دەم لە دەمی خوابی صوبحدەم<br>هەم زوڵفی قیرگوونەوو هەم چیهرەیی قەمەر | پیاهەڵدان | |
| ٥ | باری لە سروەکەت بە شنەی، ئەنگەبینی گەز<br>کردوویە جونبوشت بە هەمئاغۆشی نەیشەکەر | پیاهەڵدان | |
| ٦ | وەختی طەوافی عاریضی دڵبەر، شنۆیی تۆ<br>لە غزش دەخا بە طوڕڕە، لە سەر تا بە پێی کەمەر | پیاهەڵدان | |
| ٧ | کەی دێتە خەندە غونچە، دەمی، بێوەزیدەنت؟<br>گەر تۆ نەبی، درەختی چەمەن ناگری ثەمەر | پیاهەڵدان | |
| ٨ | ئیحیاکونی جەمیعی نەباتاتی عالەمی<br>ڕەعنا کشا لە تەربیەتت قامەتی شەجەر | پیاهەڵدان | |
| | ئابی حەیاتی ئاتەشی ئەفسوردەیە دەمت<br>تەحریکی تۆیە گڕ لە تەنوورا کە دێتە سەر | | |



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٩ | | پیاهەڵدان | |
| ١٠ | میحنەت ئەوەندە زۆرە، دڵم هێندە تەنگ بووە<br>دوودی هەناسەیی سەحەرم هەوری گرتەبەر | نارەزایی دەربڕین | |
| ١١ | هیممەت كە چابوكانە بە ئیجرایی مەطڵەبم<br>لەمسەر بڕۆ وەكوو بەرید و لەوێ بێ وەكوو تەتەر | تكاكردن | لە ڕێگەی گوتەیەكی داخوازییەوە، شاعیر تكادەكات، كە هەوڵبدات گورج وگۆڵانە بە دەم داواكارییەكانییەوە بڕوات و جێبەجێیان بكات. |
| ١٢ | بۆ موڵكی شامە نامەیی من، سوویی"نالی"یە<br>هەر حەرفی ئەو لە وەضعی ویلایەت دەدا خەبەر | ڕوونكردنەوە | شاعیر ڕوونكردنەوە دەدات، لەوەی كە ئەم نامەیە بۆ موڵكی شامە، ئەمەش ئەوەمان پێدەڵێت؛ لەوكاتەدا "نالی" لە وڵاتی شامی ئەوكاتەدا ژیاوە. |
| ١٣ | پرسیویە_ظاهیرەن_ لە ڕەفیقانی یەک جیهەت<br>ئەحواڵی ئەصڵی شەهر و موقیمانی سەربەسەر | وەڵامدانەوە | |
| ١٤ | لەوساوە حاكمی بە ستەم دەربەدەر كرا<br>نەیدیوە كەس لە چیهرەیی كەس جەوهەری هونەر<br>تا بوو بە جایی مەطلەعی خورشیدی موڵكی ڕۆم | زانیاری بەخشین | |
| ١٥ | سووتا گیاهی تیشنەوو خوشكیدە بوو شەمەر | زانیاری بەخشین | |



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٦ | ناکەن هەوایی هیچ کەبابێ ذەلیلی شەهر<br>بوریانە بەس لە ناری غەما، پارەیی جگەر! | زانیاری بەخشین | |
| ١٧ | جوز گاهی ئاه و گریە لە ئەییامی ڕۆمییا<br>نەمدیوە وا ببێ لە فەرەحدا لەبی بەشەر | زانیاری بەخشین | |
| ١٨ | (سەیوان) پڕە لە شەخصی ستەمدیدە، خوار و ژوور<br>هەر قەبری پڕ غەمانە بە هەر لا دەکەم نەظەر! | زانیاری بەخشین | |
| ١٩ | جێی تورکەکانی ڕۆمە دەر و ژووری (خانەقاە)<br>غافڵ هەموو لە جایی موریدانی با خەبەر! | زانیاری بەخشین | |
| ٢٠ | ئەو حەوضە پڕ دەبوو کە وەکوو چاوەکانی ئەو<br>تەغییرە ئاوی وەک دڵی مەردانی پڕکەدەر | زانیاری بەخشین | |
| ٢١ | ئەو دەشتە جایی یاریی یارانی حوجرە بوو،<br>یەکسەر مەقامی ڕۆمییە هەروەک تەهی سەقەر | زانیاری بەخشین | |
| ٢٢ | سووتا دڵم بە حاڵەتی جۆباری (سەرچنار)<br>لێڵاوە چەشمەساری وەکوو چاوی بێبەصەر | زانیاری بەخشین | |
| ٢٣ | زستانی ئەووەڵین بوو دڕا بەرگی (شێخەباس)<br>ڕۆمی ئەوەندە شوومە لە شەخصیش دەخا ضەرەر | زانیاری بەخشین | |
| ٢٤ | وەک پیری خوردساڵە خەمی داری (پیرمەصوور) | زانیاری بەخشین | |



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

| | | | |
|---|---|---|---|
| | مەشغوولی لەغزشە، هەمە جا، پایی تا بە سەر | | |
| ٢٥ | ئەو بەردەکانی ناوی نرا قصنی شەخصەکەی،<br>دایان بە شاخی دارەکەیا، تورکی بێهونەر | زانیاری بەخشین | |
| ٢٦ | وەک چاوی بێ غەمانە، هەموو (شیوی ئاودار)<br>بەس موشکیلە لە چەشمەیی ئەو قەطرە بێتە دەر | زانیاری بەخشین | |
| ٢٧ | ئەوسا مەکانی ئاسکەبوو (کانی ئاسکان)<br>ئێستە لە دەنگ وڕەنگی ئەڕۆمی پڕە لە کەر | زانیاری بەخشین | |
| ٢٨ | ئەمڕۆ فەضایی بازیگەە جایی ڕەهزەنە<br>لەو دەشتە دێ لە غەیبەوە ئاوازی ((الحذر)) | زانیاری بەخشین | |
| ٢٩ | تا دوزد جۆیی نیمە شەبن تورکی بێنیظام<br>دوزدن هەموو لە خەرمەنی مونعیم وەکوو شەرەر | زانیاری بەخشین | |
| ٣٠ | شەهرێکە پڕ لە ظولّم و مەکانێکە پڕ لە شین<br>جاییکە پڕ لە شۆر و وڵاتێکە پڕ لە شەڕ | زانیاری بەخشین | |
| ٣١ | سەربانی پڕ لە گەژدوم و دیواری پڕ لە مار<br>گوودالی پڕ لە ڕەهزەن و صەحرایی پڕ خەطەر | زانیاری بەخشین | |
| ٣٢ | دڵ نایێڵێ بڵێم: چییە سامانی حوجرەکەی<br>هەر تۆڕی عەنکەبووتە، حیجابی بیروون و دەر!! | زانیاری بەخشین | |
| | نایێ صەدا لە پەنجەرەکەی، جوز فیغانی جوغد | | |



**DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021**

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٣ | غەیرەز شەقامی مووری نییە شوێن و پێ گوزەر | زانیاری بەخشین | |
| ٣٤ | توو خوا بڵێ بە حەضرەتی "نالی": دەخیلی بم<br>بەم نەوعە قەد نەکا بە سولەیمانییا گوزەر!! | ئامۆژگاری کردن | |
| ٣٥ | سالم" صیفەت لە بێ کەسییا با نەبێ هیلاک<br>من کردم، ئەو نەکا لە غەما خوێنی خۆی هەدەر | ئامۆژگاری کردن<br>ئامۆژگاری کردن | |
| ٣٦ | ئەم مولکە نەظمی نابێ بەبێ ضەبطی واریثی<br>بێئەو، بە قەصدی ئەم طەرەفە، با نەکا سەفەر!! | | |

لە دوای لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی مەبەستی کردەی قسەییەکان لەم چامەیەدا، لە کۆی (٣٦) دێڕە شیعردا، کە بەشێوەیەکی ڕێکخراو وەرگیراوە؛ (٢٠) زانیاری بەخشین و (٩) پیاهەڵدان و (٣) ئامۆژگاریکردن و (١) نارەزایی دەربڕین و وەڵامدانەوە و تکاکردن و ڕوونکردنەوە بە دەستهات، ئەنجامەکەش بەشێوەی ڕێژەی سەدی، بەم شێوە هێڵکارییەی خوارەوە دەرچوو:



**DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021**

وێنەی هێڵکاری ژمارە (٢)




بەپێی ئەو ڕێژەیەی، کە لە هێڵکارییەکەی چامەکەی" سالم"دا بە دەستهات، ئەوە بۆمان بەدیاردەکەوێت، (زانیاری بەخشین) لە کردە قسەییەکان بەرزترین ڕێژەی تۆمارکردووە، بە جۆرێک جگە لە (پیاهەڵدان)، ئەوانی دیکە بە هەموویانەوە نیوەی (زانیاری بەخشین)یش پێکناهێنن.

## ئەنجام:

ا- ئەو ئەنجامانەی کە لە ژمارە و ئامارەکانەوە بە دەستهات، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١- کردە قسەییەکان لە چامەکەی "نالی" دا، بەڕێژەی **%٤٠** (دڵنیاکردنەوە) بە پلەی یەکەم دێت، (زانیاری بەخشین) بە ڕێژەی **%١٩** بە پلەی دووەم دێت، (پیاهەڵدان) بە ڕێژەی **%١٤**بە پلەی سێیەم دێت، (جەختکردنەوە) بە ڕێژەی



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

**١٢%** بە پلەی چوارەم دێت، (ئامۆژگاریکردن، ڕاوێژکردن، پێشبینیکردن، گومان دەربڕین، داواکردن، پاکانەکردن، پاڕانەوە، ناڕەزایی دەربڕین، گلەییکردن) هەر یەکەیان بە ڕێژەی **٢%** دێن.

٢- کردە قسەییەکان لە چامەکەی "سالم"دا، بە ڕێژەی **٥٦%** (زانیاری بەخشین) بە پلەی یەکەم دێت، بە جۆرێک ڕێژەیەکی سەرسوڕمانی تۆمارکردووە، (پیاهەڵدان) بە ڕێژەی **٢٥%** بە پلەی دووەم دێت، (ئامۆژگاریکردن) بە ڕێژەی **٨%** بە پلەی سێیەم دێت، و (وەڵامدانەوە، ڕوونکردنەوە، تکاکردن، ناڕەزایی دەربڕین) هەر یەکەیان بەڕێژەی **٣%**دێن.

ب- ئەو ئەنجامانەی کە لە دەرەوەی ژمارە و ئامارەکانەوە بە دەستهاتوون، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١- ئەوەی جێی سەرنجڕاکێشان و تێڕامانە ئەوەیە، کە لە ڕێگەی کردە قسەییەکانەوە "نالی" لە دێڕی (٤١)ی چامەکەیدا، پێشبینی دەکات، لەوەی کە جارێکی دیکە نەتوانێت بگەڕێتەوە باوەشی نیشتیمان؛ پێشبینییەکەشی ڕاست دەرچووە؛ کە نەگەڕایەوە نیشتیمان.

٢- لە جۆری کردە قسەییەکاندا لە (ناڕەزایی دەربڕین)، "نالی" شاعیر ناڕەزایی لە چاوەڕێکردن و دووری نیشتیمان دەردەبڕێت، بەڵام "سالم" ناڕەزایی لە بارودۆخی داگیرکراوی شاری سلێمانی، لەلایەن عوسمانییەکانەوە دەردەبڕێت.

٣- لە کردەی (پیاهەڵدان)دا، "نالی" جگە لە وەسفکردن و پیاهەڵدان بە بایەکەدا لە دێڕی (٢٠)یەمدا وەسفی خەڵکی شاری سلێمانی دەکات؛ کە خەڵکێکی ڕۆشنبیر و تێگەیشتوون، بەڵام "سالم" لە پیاهەڵدانەکانیدا بە هیچ جۆرێک وەسفی خەڵکی شاری سلێمانی نەکردووە، جگە لە وەسفکردن و پیاهەڵدان بە بایەکەدا نەبێت.

٤- ئەوەی جێگەی تێڕامانە ئەوەیە، "نالی" بە یەک دێڕە شیعر پێش کۆتایی چامەکەی ڕاوێژدەکات، کە ئایا دەتوانم بێمەوە نیشتیمانم، بەڵام"سالم" بە سێ دێڕی کۆتایی لە چامەکەیدا ئامۆژگاری "نالی" دەکات، کە بە هیچ شێوەیەک نەگەڕێتەوە نیشتیمان.

٥- لە دەرئەنجامی خوێندنەوەی هەر دوو چامەکەدا دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە"سالم" ئاشکرا و ڕاستەوخۆ ناوی تورکی ڕۆمی هێناوە، بەڵام "نالی" نائاشکراوە و شاراوە لە ڕێگەی بەکارهێنانی چەند کۆدێکی وەک؛ (چایری ستوور و ڕیشی کاکەسوور) لە دێڕەکانی ٢٩، ٣٠)دا، کە دەکرێت، جگە لە کەسی نەفام، مەبەستی پێ لە تورکی ڕۆمیش بێت هێناوە؛ ئەمەش لەبەر باری ئاساییشی خۆی لەو دەوروبەرەی، کە تێیدا ژیاوە.



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

# The Speech Acts in Nali and Salim's Two Poems

**Hersh Chato Hussein**

Qadirawa Basic School, Pshdar Education, Sulaimani Education General Directorate, Ministry of Education, Kurdistan Region, Iraq.

**E-mail:** Hersh.chato@gmail.com

## Abstract:

This study is under the title of "The Speech Acts in *Nali* and *Salim's* Two Poems". It is an attempt to analyze these two poems in a pragmatic point of view, particularly in terms of speech acts. The significance of speech acts is not to recognize linguistic meaning of words in sentences and utterances, but it is according to the sender's purpose in the context that they occur. Thus, the language of poetry as a way of using language, especially classical poetry, is not an ordinary language. Consequently, the paper hypothesizes that the speech acts have to be embodied in the poems accurately because there is supposed to be a hidden and invisible meaning in every verse behind its expression and form. The scope of the study is to examine the two poems, and it is benefited from their investigation that has been done in their anthology. In addition, whenever needed, the speech acts are identified in short because much has been mentioned about them in the scientific research institutions.

**Keywords:** Speech Acts, Act Kinds, Classic Poetry, Poem.

## سەرچاوەکان

ئەحمەد، ئازاد مەحموود (٢٠٠٩)، بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر.

تۆفیق، قەیس کاکل (١٩٩٥)، جۆرەکانی ڕستە و تیۆری کردە قسەییەکان، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلێژی ئاداب، هەولێر.

حەسەن، حەمەسەعید (٢٠٠٤)، قولّپی پێکەنین، هەولێر.

حەسەن، غازی (٢٠١٦)، گوتاری سیاسی دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن لە هەرێمی کوردستاندا (شیکردنەوەیەکی پراگماتیکییە)، نامەی ماستەر، زانکۆی سۆران، فاکەڵتیی ئاداب، سۆران.

سالم (٢٠١٥)، دیوانی سالم، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی (مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و محەمەدی مەلا کەریم و فاتح عەبدولکەریم)، بەرگی یەکەم، چاپکردنی؛ بنکەی ژین بۆ بوژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی.

سەید حسێنی، ڕەزا (٢٠٠٦)، قوتابخانە ئەدەبییەکان، وەرگێڕانی؛ حەمەکەریم عارف، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی.

صحراوی، مسحود (٢٠٠٥)، التداولية عند علماء العرب، دار الطليعة للطباعة والنشر.

عەبدولواحید، ئازاد و فتاح، مەهدی (٢٠٠٨)، زمانی شیعری لەنێوان ئەزمونی شاعیر و ئیستاتیکای دەقدا (نالی وەکو نموونە)، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، بەشی (B)، ژمارە ٢٤.

عەلی، تاڵیب حوسێن (٢٠١١)، واتاسازی و چەند بابەتێکی لێکدانەوەی واتای وشە، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر

فەتاح، محەمەد مەعروف (٢٠١١)، زمانەوانی، چاپی سێیەم، چاپخانەی؛ حاجی هاشم، هەولێر.



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021

محەمەد، حاتەم وليا و محەمەد، ژيان عەبدوڵڵا (٢٠١٥)، پێكهێنانی زانیاریی و كردە قسەییەكان، گۆڤاری زانكۆ بۆ زانستە مرۆڤايەتييەكان، بەرگی ١٩، ژمارە ٤.

موشیر دزەیی، عەبدولواحید (٢٠١١)، زانستی پراگماتیک، چاپخانەی پاک، هەولێر.

موشیر، عەبدولواحید و ئەحمەد، سەردار (٢٠١٢)، تێڕوانینێكی پراگماتیكی و ڕەخنەیی بۆ دێڕە شیعرێكی نالی، گۆڤاری (الأستاذ)، ژمارە ٢٠٢.

نالی، (١٩٨٥)، دیوانی نالی، لێكۆڵینەوە و لێكدانەوەی (مەلا عەبدولكەریمی مودەریس و محەمەدی مەلا كەریم و فاتح عەبدولكەریم)، چاپی دووەم، چاپخانەی سیهر، تاران.

هدسن (1987)، علم اللغة الاجتماعي، ترجمة: د. محمود عبدالغني عياد، بغداد.

یول، جۆرج (٢٠١٦)، مەبەستناسی (پراگماتیک)، وەرگێڕانی؛ ڕەحیمی سورخی، چاپی یەكەم، چاپخانەی تاران.

Baker, Ann E and Hengeveld, Kess (2012), Linguistics, first published, printed in Singapore.

Levinson, C Stephen (1997), Pragmatics, Printed in Great British at the University Press, Cambridge.



DOI:https://doi.org/10.26750/Vol(8).No(2).Paper_3 http://journal.uor.edu.krd/index.php/JUR Vol.8. No.2,June.2021